ناوی نامیلکە: چی ڕێگرە لەبالاّپۆشیت
ناوی نووسەر: ئومێد محمد
ساڵی چاپ: ١٤٢٦ - ٢٠٠٥
نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم
بلاّوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر
تایتلی بەرگ: نەوزاد کۆیی
بەرگ: أمین مخلص
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
چاپکردنی: چاپخانەی هاوسەر لە هەولێر

لە کتێبخانەی گشتی هەولێر
ژمارەی سپاردنی (٦٢٥) ساڵی ٢٠٠٥ ی پێدراوە

تەفسیر
هەولێر- شەقامی دادگا- ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: ٢٢٢١٦٩٥- - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل: ٠٧٥٠٤٦٠٥١٢٢ — ٠٧٧٠١٣٨٧٢٩١
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com



بـە نـاوی خـوای کـارزان و کاربـەجێ ، درود وسـڵاو بـۆ سـەرگیانی پەیامـبەر و پێشەوای مرۆڤایەتی ، ئەو پەیامبەرەی ،کە ڕۆشنکەرەوەی ڕێگـای ڕاسـتە بـۆ ڕەزامـەندی خـوا و گەیشـتن بـە بەهەشـت . ئـەو ڕێگاڕاسـتەی بـە پاکی و ڕاستی و ڕەوشتی جوان ڕازاوەتەوە . ڕێگایەکە هـەر دوو بەشـی مـرۆڤایەتی بـە (هـەر دوو ڕەگـەزی نـێر ومـێ)ەوە گـرتوویانەتە بـەر بـۆ گەیشتن بـە ئارامی و خۆشی هەر دوو دنیا . جا دنیایەك کە مرۆڤایەتی تیایدا ، بە بەرنامەکەی خوایەوە جوانە ، و لە نـاو مرۆڤەکانیشدا جوانـی تایـبەتمەندکردوە بـە ئافرەت وەك ڕەگەزی مێ و لە ئاژەڵ جیایکردۆتەوە و مافی تایبەتی خۆی بۆ داناوە ، یەکێك لەوانـەی خـوای گەورە بە پێویستی داناوە . لە سەر ئافرەت باڵاپۆشیە ، کە نیشانەی باوەڕ دارییەتی . بۆیە گەر بەوردی سەرنج بدەین هەر کۆمەڵگایـــەك لای دابێـــت ، ئـــەوا دیـــاردەی چارەڕەشـــی ئافـــرەت ودواکەوتوویی کۆمەڵگا وبێ ڕێزی ئافرەت زۆر بووە ، بەڵام بە داخەوە دەبیـنین ئـەو دیارەدەیە بۆتـە شتێکی ئاسایی وبـەربڵاو ، تەنانەت لە کۆمـەڵگای ئیسلامیشدا ، هەرچـەندە جل وبـەرگی باڵاپۆشیش زۆرە .

جا دەبێت بڵێین ئایا بیانووی ئەم لادانە چی یە ، کە ڕووی کردۆتە ئافرەتی موسڵمان ؟؟؟ .

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە چەند وەڵامێکم دەست کەوتووە لە ئافرەتان خۆیانەوە ، بەڵام پاش بەدواداچونی بیانووەکان بۆم دەرکەوت هەندێکیان چوون یەکن بۆیە (١١) بیانو لەو بیانوانەتان بۆ دەخەمەڕوو :-

(١-) پرسیارم کرد ئایا لە ڕاستیدا باوەڕت بە ئیسلام هەیە ؟ !

لەوەڵام دا : بەڵێ ئەوەتە دەڵێم ( لا إله إلا الله) ئەوەش بە باوەڕەوە دەڵێم : ( محمد رسول الله ) ئەمیش باوەڕمە بەڕێبازی ئەو پەیامبەرە ، کەواتە ڕازیم کە ئیسلام یاساو ڕێبازی ژیانم بێت .

دەی باڵاپۆشی بەشێك نی یە لە یاسا و ڕێبازی ئیسلام ؟؟ . گەر ڕاست بکەیت لەوەڵامدا دەڵێیت: بەڵێ ، خوا و پەیامبەرەکەشی فەرمانیان پێ کردووە ، دەی کەسێك باوەڕی هەبێت بە ئیسلام فەرمانی خوا وپەیامبەرەکەی جێ بەجێ نەکات چی ناو دەنێیت ؟

بە هەر حاڵ ناچیتە ڕیزی ئەو کەسانەی ، کە خوا دەربارەیان دەفەرموێت ، ﴿ إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ

ورسوله ليحكم بيْنهُمْ أن يقولوا سَمِعْنَا وَأطَعْنَا وَأولئك هم المفلحونَ ﴾ [النور : ٥١] .

واتـه : بـەڵام گوفـتاری بـاوەڕداران هـەر کاتێ بـانگ دەکـرێن کەبـێر بـەرەو خـوا وپەیامـبەرەکەی تـا فـەرمان ڕەوایـی بکـات لـە نێوانیاندا . گـورج دەڵـێن : بیسـتمان وگوێـڕایەڵین بۆ هەموو فەرمانێکی شەرعی . هەر ئائەوانەشن سەرفراز وسورکەوتوو .

<u>پوختەی قسان</u> : گەر ئەو خوشکە باوەڕی هەیە بە ئیسلام دەی چۆن باوەڕی بە فەرمانەکانی نی یە ؟

(٢) ئافرەتی دووەم دەڵێ : من باوەڕم بەبالاپۆشی هەیە ، بەڵام دایکم ڕێگرمە ، گەر بە قسەی نەکەم دەچمە دۆزەخەوە .

پێغەمـبەر ﷺ وەڵامـی ئـەم خوشـکە بەڕێـزە دەداتـەوە دەفەرموێت ( لاطاعـة لمخلوق في معصـية خالق ) واتە : گوێڕایەڵی نـیـیە بۆ فەرمانی هیچ کەسێك کە سەر پێچی خوای تێدا بێت . هەرچەندە جێی دایك وباوك بەتایـبەت دایك زۆر بەرز و پیرۆزە بەڵکو خوای پەروەردگار لە چەند ئایەتێکدا لەگەڵ پەرستش و یەکتاپەرستیدا باسی کردووە

﴿ وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلاَ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا ﴾ {النساء :٣٦} .

واته : خوا بپەرستن و هیچ جۆره شەریك و هاوەڵی بۆ بڕیار مەدەن و ، چاکه کاربن لەگەڵ دایك وباوکتاندا .

گوێ ڕایەڵی دایك وباوك پێویسته ، مەگەر لە شتێکدا کە پێچەوانەی فەرمانی خوا و پەیامبەرەکەی بێت .

خوای گەوره دەفەرموێت :﴿ وَإِن جَاهَدَاكَ عَلَى أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ﴾ {لقمان : ١٥} .

واته : ئەگەردایك وباوکت کۆششیان کرد ( دنەی تۆیان دا ) شتێ بکەی بە شەریکم ، کە خۆت هیچی لێ نازانی فەرمانیان بەجێ مەهێنە . گوێڕایەڵی نەکردنیان ڕێ ناگرێ لەچاکەکردن لەگەڵیاندا

﴿وصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفاً ﴾ {القمان : ١٥} .

واته : لەدنیاشدا هاوڕێ وهاوەڵ وخزمەتگوزارێکی چاك بە بۆیان.

*پەخشەی قسان* : چۆن گوێڕایەڵی دایکت دەکەیت و فەرمانی خوا دەشکێنی کەتۆش ودایکیشتی درووست کردووه ؟! بەلام ئەم جۆره

کەسانەش لەئافرەتان لەکەمی زانیاریان یاخود نەبوونی زیانیاری لەئیسلام ئەم جۆرە بیانووە دەهێننەوە .

(٣) ئافرەتی سێهەم دەڵێ : من حەزم لەبالا پۆشی‌یە ، بەڵام دەستم کورتە .

دەتەوێت بە پۆشاکێکی بریق وباق وگران بەهاو ، هەر ڕۆژە بەمۆدێلێك بچیتە دەرێ .

بەڵام بەهەرحاڵ ئایانازانی ئەی خوشکی موسڵمان دروست نی‌یە لەماڵ بچیتەدەرێ بەهیچ شێوەیەك، تا مەرجەکانی پۆشاکی موسڵمانانەت لەبەردا نەبێت ، کەپێویستە هەموو خوشکێك مەرجەکان بزانێت .

لە کاتێکدا گەر پرسیار بکەیت لەبارەی کاروباری دنیاوە هەمووی دەزانن ، بەڵام ئەی خۆتان فێرناکەن لەو شتەی کە لە دۆزەخ دەتان پارێزێ، گەر نازانن پرسیاربکەن وەك خوای گەورە دە فەرموێت ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ {النحل : ٤٣}

واتە : ئەگەر ئیوە نازانن ، دەی لە شارەزایان بپرسن .

دیارە فێربوونە کەش ( فرض العين )ە وەکو نوێژ، گەر هەر دەبێ بچیتە دەرەوەی ماڵ ئەوا بەبێ پۆشاکی شەرعی مەچۆ دەرێ لەبەر ڕەزامەندی خوا وسەرشۆرکردنی شەیتان ، چونکە چونە دەرەوەت بەبێ پۆشاکی شەرعی تاوانەکەی زیاترە لەو کارەی بۆی دەچی

ئەگەر ڕاست دەکەیت و دەستت کورتە ، ئەوا نیەتت بۆ خوا یەکلا بکەرەوە، ئەوا خوای کاربەجێ کار ئاسانیت بۆ فەراهەم دێنێت و چەندین کەس مەمنون دەبن ،کە دەستی خیرت بۆ درێژ بکەن ئەوە نی یە خوای بەخشندە دەفەرمووێت ، ﴿ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجاً ۞ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ﴾ {الطلاق : ٢-٣} .

واتە : هەر کەسێ لەخوا بترسێ دەرووی لێ دەکاتەوە ، لە شوێنێکەوە بژێوی بۆ دەنێریت، کە بەخەیاڵیدا نەهاتووە .

وەلە کۆتایی دا بەو خوشکە دەڵێم کەبریق باقی دنیاو مۆدیلاتی دەوێ، بەرزی وڕێز وقەدر لای خوا ، بە جلی جوان وڕەنگا وڕەنگ ومۆدیل نییە ، بەڵکو بەگوێ ڕایەلیتە بۆ فەرمانەکانی خوا وپەیامبەرەکەی ، ئەوەتە خوا دەفەرمووێت ؛ ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ﴾ {الحجرات :١٣} .

واتە ، بەرێز ترینتان لای خودا ، ئەوکەسەیە زیاتر لەخودا دەترسێ و خۆی لە گوناهان دەپارێزێ .

یاخود پەیامبەرەکەی دەفەرمووێت : ( **ان الله لاینظر إلى اجسامكم ولا إلى صوركم ولكن ينظر إلى قلوبكم** ) **رواه مسلم**

واتە : بێگومان خوای گەورە سەیری جەستەو شێوەتان ناکات ، بەڵکو سەیری دڵەکانتان دەکات .

**پوختەی قسان** : لەپێناو ڕەزامەندی خوا وچوونە بەهەشت هەموو شتێکی قورس وگران بەها بۆت ئاسان دەبێت .

(٤) ئافرەتی چوارەم دەڵێ : دنیا گەرمە ومنیش بە گەرما ناڕەحەت دەبم ، جا بالاپۆشیش بکەم ئەوەندەی تر گەرمام دەبێ .

بۆ وەلامی ئەم خوشکەو هاووێنەکانی دەڵێم گوێ بگرن بزانن خوا چی دەفەرموێت ﴿ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرّاً لَّوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ ﴾ {التوبة :٨١} .

واتە: پێیان بڵێ ( ئەی محمد ﷺ ) : خۆئاگری دۆزەخ زۆر گەرمترە ، ئەگەر تێگەیشتنیان هەبوایە .

چۆن بەراوردی گەرمی دنیا و دواڕۆژ دەکەیت ، بزانە ئەوە شەیتان ڕاوی کردوویت جا خۆت ڕزگار بکە ،چونکە ئەو دەیەوێ لە گەرمی دنیا دەرت بکا بۆ گەرمی دۆزەخ .جا ئازابە و خۆت ڕزگار کە ،با گەرمی ڕۆژ ببێتە یادکەرەوەیەك بۆت بۆ گەرمی دۆزەخ ، ئەو گەرمییەی ، کە چەندەها ئەوەندەی گەرمی دنیایە ،جا هەوڵدە خۆت دوورکەیتەوە لێی . ئەوەتا خوای گەورە لەبارەی ئەهلی دۆزەخەوە

دهفهرموویّت : ﴿ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا ۞ إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا ﴾ {النبأ : ٢٤-٢٥} .

واته : له ناویدا ناچێژن فێنکایيهك ، یا خواردنهوهیهکی بهتام ۞ جگه له ئاوی لهکولّ وکێم وزووخاو نهبێت . حیکمهتی بالآپۆشیش له دهیاها نهخۆشی دوور دهخاتهوه، که زانستی سهردهم دهری خستووه ، که ڕووتی ئافرهتان و جل وبهرگی تهسك کار دهکاته سهر :-

١- نهخۆشی پێست .

٢- کزی چاو .

٣- بیرو هۆشی ئافرهت ...هتد .

<u>پوختهی قسان</u> : بهههشت بهناخۆشی ئابلۆقه دراوه ، دۆزهخیش به ههواو ئارهزوو .

(٥) با بزانین ئافرهتی پێنجهم چ بیانوویهك دێنێتهوه ، تا پۆشاکی شهرعی نهپۆشێ دهڵێ : من دهترسم گهر بالاّ پۆشی بکهم بهردهوام نهبم و وازلێ بێنم ، چونکه زۆر کهسم بینیوه ،که بالآپۆش بووه و وازی لێ هێناوه !

* منیش بۆ وهلامی ئهو خوشکه و ئهوانهی وا بیر دهکهنه وه دهڵێم : ئهگهر ههموو کهس وهك تۆ بیر بکاتهوه ، ئهوا دهبێ واز له ههموو ئایین

ڕۆژی قیامەتیشــدا بــە کوێــری حەشــری دەکــەین . هەوســەرگرتن بەهـرەیەکی خواییە ، خوا بە هەر کەسێك بیەوێ پێی دەبەخشێ ، بە جل وبـەرگ نـیـە، چەندین بالاپۆشـی گەیشتن بە هاوسەری خۆیان، چەندین سافرەش پرچی سپیان هۆنیەوە .

**پوختـەی قســان** : خوا بەرەکەت ناخاتـە هاوسـەر داریەکەوە ، کە بەشکاندنی فەرمانەکانی بێت .

(٧) ئافرەتی حەوتەم زۆر نەزانانـە ووتـی : نەکردنی بالاپۆشیم بە فەرمانی خوایە ؛ ئەوەنیە خوا دەفەرمووێت:

﴿ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴾ {الضحى : ١١}.

واتـە : تـۆ هـەر باسـی چاکەو نیعمەتەکانی پەروەردگارت هەمیشە بدوێ و لە جێی خۆیاندا بە کاری بهێنە .

ووتــی مــن چــۆن شــتێك بشــارمەوە خــوا ی پــەروەردگار پــێمی بەخشیوە؟

* لـە وەڵامدا دەڵێم: ئەم خوشکەمان گوێ ڕایەڵی خوایە بەبۆچونی خـۆی ، گـەرواش بێـت ،چونکە لەگەڵ ئارەزووەکانی خۆیدا دەگونجێ و بـێ گوێـی فەرمانـێك دەکـات کـە بـەدڵی ئـەو نـی یـە . گـەر وانـیە بـۆ گوێرایەڵی فەرمانی خوا ناکات کە دەفەرمووێت :

﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ﴾ {النور :٣١} .

واتــه :جوانــی خۆیــان دەرنەخــەن ، جگــه لــەوەی کــه دیاره (وەك دەم وچاو ودەست ) .

یان دەفەرموویت: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ﴾ {الاحزاب : ٥٩} .

واته: ئەی پەیامبەر بەهاوسەرانت و کچەکانت و ئافرەتانی باوەڕدار بڵێ ، کە بە پۆشاکی بالاپۆش خۆیان داپۆشن .

جا خوشکم بەو وتەیە خۆت ڕێبازێکت بۆ خۆت داناوه ، کە سفوریە ؟!! ئەمــەش پێچەوانەی فەرمانی خوایە ، هۆکارەکەشی نەناسینی خوا و شــەریعەتەکەیەتی ، جا گەورەتــرین بەهــرە ، کــه ئادەمــیزاد شانازی پــێوە بکات ئــیمان و پەیوەست بوونــیەتی بــەو ئیمانەوە ، کەواتە بۆ ئــەوە دەرناخەیــت و شــانازی ناکەیــت پــێوەی ، بــێ گومــان بالاپۆشیت بەشــێکە لــەو بەهــرەیە کــە فەرمانــێکە وەکــو فەرمانــەکانی تــر ، بەندایەتیەکە وەکو بەندایەتیەکانی تر .

***پوختــــەی قســــان*** : ئایا هــیچ بەهــرەیەك هەیــە گــەورە تربێــت لــە بالاپۆشیت ، کە نیشانەی ئیمانتە .

بێنێت ، وەك نوێـژ ، چونکه کەسانێك نوێژ دەکەن و وازی لێ دێنن ، کەسانێکیش واز له ڕۆژو وزکات دێنن ... هتد .

جا بزانه خوشکی بەڕێز ئەمه شەیتان وات لێدەکات وا بیر بکەیتەوه چونکه کەوتوویته داوی شەیتان ودەیەوێت له ڕێگەی ڕاست دوورت بخاتەوه بەو بۆ چونه لاوازو گەنەڵانه . بەڵام ئاگاداربه و بزانه خوای گەوره کارێکی پێخۆشه بەردەوام بێت با کەمیش بێت . هەر وەك پەیامبەرەکەی ﷺ دەفەرمووێت:﴿أحب العمل إلى الله أدومه إنْ قلّ﴾ جا باشه بۆچی لەو کەسانه ناکۆڵیتەوه ، که وازیان له باڵاپۆشی هێناوه تا ببێت به ئەزمون بۆ تۆ و ، هەوڵ بدەیت بەسەر هەموو ئەو هۆکارانەی ، که دەبنه هۆی دامەزاندنت لەسەر باڵاپۆشی وئاینت . هەندێك لەو هۆکارانەی دەبنه دامەزراویت لەسەر ئاین وباڵاپۆشی دوعا زۆر کردن ، که دڵت جێگیر بکات لەسەر ئاین ونوێژەکانت لەکاتی خۆیدا و بەزەلیلی کردنی و داوای کۆمەك کردن له خوا به خۆڕاگری وئارام گرتنت ﴿ وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلاَّ عَلَى الْخَاشِعِينَ ﴾ {البقرة: ٤٥} .

واته : پەنابەرنه بەرئارامگرتن و نوێژ کردن ، که کارێکی زۆر گرانه تەنها لەسەر ئەوانه نەبێت که مل کەچی فەرمانی خوا.

پوختـەی قسان : گـەر دەست بگری بە هۆکاری هیدایەت وەرگرتنت و تامی باوەڕداریێتیت چەشت ، ئەوا هەرگیز فەرمانی خوای گەورە وازلێ ناهێنیـت . هۆکـارێکی تـر زۆرگـرنگ تـێکەڵ بونـتە بـە خوشـکانی موسڵمانان و بەشداری کردن خۆشی و ناخۆشیەکانیان .

٦ شەشەمیان ووتی : گەر بالاپۆش بم کەس نایەتە داخوازیم ، بۆیە بڕیارم داوە دوای هاوسەرێتی بالاپۆشی بکەم .

- مـن بـەم خوشـکە دەڵـێم: کەسـێك دەیەوێـت تـۆ سـافرەبیت و دێـتە داخوازیـت ، کـە سەرکەشـی فـەرمانی خـوا بێـت . کەسێکیش فەرمانی خوا جێبەجی نەکات شیاوی تۆی خاوەن باوەڕنیە ، چونکە پیاوی وا هـیچ جوامـێریەکی تـیانی یـە بەرامـبەر بـە حـەرام کـراوەکانی خـوا ، یارمــەتی دەریشــت نابێــت بــۆ ڕۆیشــتنت بــەرەو بەهەشــت و دوور کەوتــنەوەت لــە دۆزەخ . هەرماڵێکـیش بنچـینە و بـناغەی لەســەر شـکاندنی فـەرمانی خـوا وپەیامـبەرەکەی بێـت ئـەوا نەلەم دنیا خۆش دەگوزەرێنێـت وە نەلـەو دنیا ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكاً وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى ﴾ {طه : ١٢٤} .

واتە : ئەوەی ڕوو وەربگێڕێت لەبەرنامە و یادی من و پشتی تێ بکات ، بێگومانە بۆ ئەو جۆرە کەسانە ژیانێکی ترش وتاڵو ناخۆش هەیە ، لە

٨) ئەم خوشکە دەڵێ : من دەزانم بالآپۆشی واجبە ، بەلأم کاتێك دەیپۆشم کە خوا هیدایەتم بدات !!!

منیش پرسیار لەو خوشکە دەکەم ، ئایا ئەو ئەو هەنگاوانە چین بۆ ئەو هیدایەتەی ، کە چاوەڕوانی دەکەیت ؟ چونکە ئێمە دەزانین خوای پەروەردگار بۆ هەر شتێك هۆکارێکی داناوە ، بۆ نمونە نەخۆش دەرمان دەخوات ، تا خوای گەورە شیفای بدات ، یان کەسێك بیەوێ سەفەربکات ، دەبینی پێداویستی سەفەرهەر لە پۆشاك وخواردن ودراو سەیارە ئامادە دەکات ، تا سەفەرەکەی سەرکەوتوو بێت ، تۆ چیت ئامادەکردووە بۆ دوا ڕۆژت ...هتد . ئەی خوشکی بەڕێزا ئەو هەنگاوانە چین ناوتە بۆ بالآپۆشیت ، ئایا هیچ کاتێك دوعای بەکوڵت کردووە ؟ یان بۆ جارێك لەگەڵ ئافرەتی خاوەن بروا دانیشتوویت گوێت بۆ شل کرد بێت ؟ چونکە دانیشتنت لەگەڵیان باشترین یارمەتی دەرە بۆ هیدایەتت و بەردەوامیت لەسەر بالآپۆشین و زیادکردن و پتەوکردنی باوەڕت . کەواتە فەرمانی خوا بەجێ بێنە و بالآپۆشی بکە بالآپۆشیەك کە فەرمانی خوای کارزان و کاربەجێ یە . ئەوەش بزانە ڕاستە هیدایەت لەلایەن خوای گەورەوەیە ، بەلأم تامردن دانیشتن و تەمەنا نی یە وەك حەسەنی بەصری دەفەرمووێت: ( ليس الأيمان بالتمنى ، ولابالتحلي ولكنه شيء وقر في القلب

و صدقه العمل ) واته باوەڕ بەتەمەنا کردن خۆڕازاندنەوە نىیە ، بەڵکو شتێکە لە دڵدا جێگیر دەبێت و کردەوەش تەسدیقی دەکات .

**پوختەی قسان** : گەر ئەو خوشکەو هاوشێوەکانی ڕاست بکەن لە داخوازی هیدایەت ، ئەوا هەوڵی جێبەجێ کردنی ئەو هۆکارانە دەدەن ، کەدەیگەیەنێت بە بالآپۆشی ڕاستەقینە .

(٩) خوشکی نۆیەم دەڵێ : من حەز دەکەم بالآپۆشی بکەم ، بەڵام دەترسم لە کاتی دامەزراندا لەسەر کار دام نەمەزرێنن ، یان ئەگەر لەسەر کاربم دوورم بخەنەوە ، یان مامەڵەی باشم لەگەڵ نەکەن و خۆم ومالّ منداڵم نان براوببین .

لە وەلامی ئەم خوشکە وهەموو ئەو خوشکانەی بەم جۆرە بیر دەکەنەوە ، دەڵێین: ئایا نازانی خوای گەورە ڕازقی تۆیە ، کە دەفەرمووێت :﴿ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ﴾ {الأنعام: ١٥١} .

واتە : ئێمە بژێوی ئێوە وئەوانیش واتە منداڵەکانیش دەدەین .

وەیان دەفەرمووێت :

﴿ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُم ﴾ {الإسراء: ٣١} .

واتە : ئێمە بژیوی منداڵەکانتان و خۆشتان دەدەین .

کەوتە گەر دەترسی لەوەی خۆتان نان بڕاوبن ، یان دەڵێن لەبەر منداڵەکانم ئەوا ئەو بژێوەی کەدیاریکراوە بۆت لەلایەن خواوە کەس ناتوانێت ڕێگری بکات لەوەی بەدەستت بگات ، یان بۆت زیاد بکات لەبەر نەپۆشینی باڵآت. جا دونیایەك ئەگەر هیچ کەم وکوڕی تیانەبێ ، دوو کەم وکوڕی چارەنەویستی تیایە :

١- مرۆڤ ناگاتە حاڵەتێك ، کە ئاواتی ببڕێ وبڵێ ئۆخەیش هەرچم ویست دەستم کەوت .

٢- ئەو بەشە کەمە ناتەواوەی ، کە دەستت کەوتووە دڵنیانیت لەوەی ، کە تا کۆتای ژیان لە دەستا دەمێنێتەوە و، لە دەستت دەرناچێ . ئەگەر لە هەر لایەکەوە دڵ ئارامی پەیدا بکەیت لەوە دڵنیانابی ، کە تۆ لە دەست ئەو دەربچی وبمری . جاکەواتە لە خوا بترسێ چونکە خوا دەفەرموویێت : ﴿لَهُمْ فِيهَا مَا يَشَاؤُونَ خَالِدِينَ ۚ كَانَ عَلَى رَبِّكَ وَعْداً مَسْؤُولاً﴾ {الفرقان : ١٦} .

واتە : لەو بەهەشتەدا هەرچی داوای بکەن بۆیان ئامادەیە هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەبڕاوەدا ، ئەوەش بەڵێنێکە لەلایەن پەروەردگارتەوە.

(١٠) خوشکی دەیەم دەڵێ : هێشتا کات ماوە جارێ گەنجم ، کە گەورە بووم ، یان حەجم کرد ئەو کاتە پۆشاکی شەرعی لەبەردەکەم .

خوشکم بزانە فریشتەی ڕوح کێشان میوانە ولەبەر دەرگا وەستاوە . چاوەڕوانی خوایە فەرمانی بکات بە گیان کێشانت ﴿فَإِذَا جَاء أَجَلُهُمْ لاَ يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلاَ يَسْتَقْدِمُونَ﴾ {الأعراف : ٣٤} .

واتـە :ئەگـەر وەخـتی مردنـیان هـات ، نـە تـاوێك پـێش دەكـەوێ، نەتاوێكیش دوا دەكەوێ .

پێشینان دەڵێن :شوان تا دانیشێت مەڕەكەی دوور دەكەوێتەوە .

هەر وەك شاعیر دەڵێ :

گەر ڕانەپەڕین ، دەردمان گرانە
دۆم بەدانـیشتن ، مـاڵی وێرانە

دەی مـردن گـەورە و بچووكی نـازانێ ، وەك دەڵێن : مـردن گەورەی هەموانـە ، چـەند كـەسمان بیـنی ئاواتـەكانی خستـە ژێـر گڵـەوە ، جـا وریابە مردن یەخەت پێ نەگرێ بۆ ئەو سەفەرە وتۆش ، بێ ئاگابیت وخـۆت كۆنەكـرد بێـتەوە بـۆی . بـزانە بـە لەبـەر نەكـردنی پۆشـاكی شـەرعی دژایـەتی كردنـتە لەگـەڵ خـوا و پێغەمـبەرەكەی ، جـا هـۆش بكـەرەوە و دەسـت و بـرد بكـە بـۆ بـەجێ هێـنانی فەرمانەكانی خوا و وەڵامـی پەروەردگارت بـدەرەوە ﴿ سَابِقُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ

وجنة عرضها كعرض السماء والارض ﴾ {الحديد : ٢١ }.

واته : پێشبڕکێ بکەن بۆ بەدەست هێنانی لێ خۆشبوون لەلایەن پەروەردگارتانەوە و بەدەست هێنانی ئەو بەهەشتەی ، کەپانتایەکەی وەك پانتای ئاسمان وزەویە .

جا خوشکم ئاگاداربە گەر خوا لە بیربکەیت ، ئەوا خۆشت لەبیر دەکەیت ، وەك خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ نَسُوا اللَّهَ فَنَسِيَهُمْ ﴾ {التوبة : ٦٧} .

واته خوایان له بیرکرد ، خواش ئەوانی فەرامۆش کرد. دەفەرمووێت ﴿ نَسُوا اللَّهَ فَأَنسَاهُمْ أَنفُسَهُمْ ﴾ {الحشر : ١٩} .

واته : وەکو ئەوانە مەبن کە خوایان فەرامۆش کردوو ، خواش خۆیانی لە بیر خۆیان بردۆتەوە ، هەر ئەوانە لەفەرمانی خوا ، دەرچوو ولادەرن .

خوشکی بەڕێزا لە هەر تەمەنێك دایت وازبێنە لە بێ فەرمانی پەروەردگار ، کە بالاپۆشیش بەشێکە لە فەرمانەکانی ، بزانە پرسیارت لێدەکات لە گەنجیت بەتایبەتی ولە هەر ساتێکی تەمەنت بە گشتی ، بزانە خوا ( شديد العقاب )ە .

**پوختەی قسان** : ئای مرۆڤ چەند هیوات بە ژیان هەیە ، بەڵام :

شەرابە ئاکامی مردن پێی ئەگەی نۆشی ئەکەی
خاك بەسەر خۆڵ بەدامان بۆ فەرامۆشی ئەکەی
مردن ساتێ لە پڕ دێ گۆڕی تەنگ وتاریکە جێت
فیکرەیە باوەڕ ڕووناکە خۆت بۆ فەرامۆش ئەکەی
کردەوەی بەد ئاگری دۆزەخ بەتینتر پێ دەکا
جا کەوا بوو بۆ بە دەستی خۆت بۆ خۆت خۆشی ئەکەی

(١١) خوشکێکی تر ووتی : ئەترسم ئەگەر پۆشاکی شەرعی بپۆشم پەنجەی حزبیم بۆ ڕابکێشن ، منیش ڕقم لە حیزبایەتییە .

- خوشکی موسڵمان پێشەکی پێت دەڵێم دوو حیزب هەیە ، ئیسلامیش هاتووە بۆ جیاکردنەوەی ئەو دوو حیزبە ، حیزبی یەکەم: حیزبی خوایە و نیشانەیان ئەوەیە ، کە خوا سەریان دەخات بەهۆی گوێ ڕایەڵییان بە فەرمانەکانی و دوور کەوتنەوەیان لە نەهیەکانی . حیزبی دوو بریتیە لە حیزبی شەیتان ، ئەوانەن کە فەرمانەکانی خوا دەشکێنن و خراپە لەسەر زەوی بڵاودەکەنەوە . جا کاتێك تۆی موسڵمان فەرمانی خوا جێبەجێ دەکەی بە باڵاپۆشیت ، دەبیت بە کۆمەڵی خوا ، کە سەرکەوتوون . کاتێکیش لەشی خۆت دەردەخەیت

ئـەوا سـوارى كەشتى شەيتان بوويت لەگەڵ دووڕووەكان وبێ باوەڕەكاندا ، ئەوانــە خــراپ تــرين هــاوەڵن . جــا دەبينيــت چــۆن لــە دەســتەی خواناســـان دەردەچـــی و ، دەچـــيتە دەســـتەی شـــەيتانەوە وچـــاكە دەگۆڕيـتەوە بە خراپە . جا خوشكی موسڵمان ڕاكە بەرەو لای كۆمەڵی خوا بەجێ بەجێ كردنی ڕێبازی خوايی .

﴿فَفِرُّوا إِلَى اللَّهِ إِنِّي لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ {الذاريات : ٥٠} .

واتــە : خـێرا بــەرەو لای خــوا بــڕۆن بەڕاسـتی مــن ( پێغەمـبەر ﷺ ) لەلايەن خواوە ترسێنەرێكی ئاشكرا وڕونم بۆ ئێوە .

خوشـكم ! بــزانە بالآپۆشــی جــێ بــەجێ كــردنی فــەرمانی خوايــە و پەيوەندی بە هيچ بۆچونی كەسێك ، يان فەرمانی لايەنێكەوە نی يە، چــونكە ئــەوەی كەفــەرمانی پــێ كــردووە كــارزان و دروســت كــەری هەموانــە وەك دەفــەرموێ ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ﴾ {الاحزاب:٥٩} .

واتە: ئەی پەيامبەر بەهاوسەرانت و كچەكانت و ئافرەتانی باوەڕدار بڵێ : كە بە پۆشاكی باڵاپۆشی خۆيان داپۆشن .

شاعيريش دەڵێ :

بـــەرگی ڕێـــزە جـــێنشيـــنی كردگار لەسەر زەوی
تۆ بەرگی شاديت ببێ ، گەوجی سەرخۆشی ئەكەی

دڵنـــیابـن دێـت و دەڕوا ، گەپڵەیە ژیـن سێبەرە"

نەفامی ، بێ باکی لێ ی ، خـۆتی بێ هۆشی نـەکەی

پـێش ئـەوەی ئـەم حـیزبانه هەبێت بالاْپۆشی هەبووه و فەرمانێکی خوایی‌یه نەك حیزبی ، له سالاْنی پەنجاکانیش له کوردستاندا دایکانی ئەو کاته بەبێ پەچەو گۆرەویش نەهاتونەته دەرەوە .

<u>پوخـــتەی قســـان</u> : بـۆ گەیشـتن بـه ڕەزامـەندی خـوا وئومـێدی گەیشـتنمان بـه بەهەشـت ، هـەموو قسـەیەکی شـەیتانەکانی مـرۆڤ وجـنۆکه وەلاوە بـنێ ، بـه تونـدی دەسـت بگـره بـه یاسـای خوایی ، دایکـانی موسـوڵمانان و خـێزانی هـاوەلاْنی پەیامـبەر و هـەموو ئـەو ئافـرەتانەی بـه پاکـیان مێژوویان ڕازاندۆتەوه بیان کەره سەر مەشقی خۆت .

لـه کۆتـایدا بـەبێ پـێچ و پـەنا دەڵێم :خوشکی بەڕێز ! لەشی خۆت دەرمەخـه و هـەڕاجی مەکه له بازاڕی شەیتان و ، دڵی بەندەکانی خوا ئازارمـەده پـێی . چاك بـزانه تەسلیم بوونـت بـه پۆشـاکی شـەرعی و دوورکەوتـنەوەت لـه فـەرمانی خـوا دەبێـته هـۆی توڕەبونـی خوا و ڕەزامـــەندی شـــەیتان چـــونکه هـــەرڕۆژێك دەڕوات دەبێـــته هـــۆی دوورکەوتـنەودت لـه خـوا و زیاتـر نـزیك بونەوەت له شەیتان . هەروا

دەبێتە هۆی نەفرەت لێ کردنت لە ئاسمان و زەوی ، هەتا تۆبە دەکەی. ڕۆژانە ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر لەقەبری تاریك و شکێنەری ئەو لاشەیەی ، کەپێیی دەنازێت و کردۆتە هۆی دژایەتی کردنی خوا ، نزیك تر دەبێتەوە و فریشتەی گیان کێش خۆی بۆت ئامادە کردووە ، تا ڕوحت لە لاشەت جیا بکاتەوە ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ الْمَوْتِ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَمَن زُحْزِحَ عَنِ النَّارِ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ وَما الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلاَّ مَتَاعُ الْغُرُورِ﴾ {آل عمران:١٨٥}.

واتە: هەموو کەسێك دەبێت بمرێت و مردن بچێژێت ، تەنها لە ڕۆژی قیامەتدا کرێ و پاداشتان بە تەواوی پێدددرێت (دەرئەنجامی کردەوەکانتان دێتەوە ڕێتان ) ئەوسا ئەوەی دوور خرایەوە لە ئاگری دۆزەخ و خرایە بەهەشتەوە . ئەوە بەڕاستی سەرفرازبووە ، ژیانی دنیاش بێجگە لەوەی کە ڕابواردنێکی خەڵەتێنەرە شتێکی تر نیە ،جا دەڵێم سواری شەمەندەفەری تەوبە ببە پێش ئەوەی شەمەنەفەرەکە لەوێستگەکەت بڕوات .وەبیربکەرەوە پێش ئەوەی بەیانی بێت ، ئێستا بیری لێ بکەرەوە پێش ئەوەی لەدەستت بچێت . نیشی ئەمڕۆ مەخەرەسبەی ، دووبارە من ئەڵێم و ئەرکی سەرشانم بەمەش سوکتردەکەم گەرچی هێندێ کەس ئەڵێن تۆ بەران دۆشی ئەکەی .

خوشکی بەڕێز! إن شاء الله پاش ئەوەی بڕیاری بالآپۆشیتدا ، پێویستە ئەو بالآشیەت مەرجەکانی بالآپۆشی شەرعی تێدابێت ، کە ویستمان باسی بکەین ،بەلآم لەبەر بوونی نامیلکەی ( حیجاب و خۆداپۆشینی شەرعی ئافرەتان لە ئیسلامدا ) ، کە لەلایەن برای بەڕێز ( جلیل إبراهیم )ە کۆکراوەتەوە وئامادەی کردووە و هەردوو مامۆستای بەڕێز ( عدنان بارام و محمد عبد الرحمن )ە پێداچوونەتەوە .خوای گەورە پاداشتی بەخێریان بداتەوە ،ئێمە باسی ناکەین .بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێرەوە سەر ئەو نامیلکەیە ، بەلآم لێرەدا حەزم کرد بە کورتی و بە خاڵ و مەرجەکانی بالآپۆشی شەرعی بنووسین ، کە ئەمانەیە :

١ پێویستە هەموو جەستە داپۆشێت ، جگە لە دەم چاو هەر دوو دەست

٢ پێویستە قوماشەکەی سەرنج ڕاکێش و بریقە دار نەبێت

٣- پێویستە بۆندار نەبێت .

٤- پێویستە تەسك نەبێت

٥ پێویستە تەنك نەبێت .

٦ پێویستە لە جل وبەرگی پیاوان نەچێت .

٧- پێویستە لە جل وبەرگی کافران نەچێت .

پێویستە بە جۆرێك نە بێت ،کە نەو جلە تووشی فیز و لەخۆبای بوونت بکا

# خوشکی بەڕێز گەردەتەوێ

- بچیتە بەهەشتەوە ئەوا بالآپۆشی بکە : چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت :

﴿ کل إمتي یدخلون الجنة إلا من أبی ،قالوا : یارسول الله ومن یأبی ؟ قال : من أطاعني دخل الجنة ، ومن عصاني فقد أبی ﴾ .

- بەر نەفرینی پێغەمبەر ﷺ نەکەوی بالآپۆشی بکە چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت :

﴿ سیکون في آخر امتي نساء کاسیات عاریات ، علی رؤوسهن کأسنمة البخت ، العنوهن فإنهن ملعونات ﴾ .

- یەکێك نەبیت لە ئەهلی ئاگر ئەوا بالآپۆشی بکە : چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت :

﴿ صنفان من أهل النار لم أرهما بعد : قوم معهم سیاط کأذناب البقر یضربون بها الناس ، ونساء کاسیات عاریات ، مائلات ممیلات رؤوسهن کأسنمة البخت المائلة ، لایدخلن الجنة ولایجدن ریحها ، وإنَّ ریحها لیوجد من مسیرة کذا وکذا ﴾ .